# فەرمانبەر

## چۆن ئەرکی سەرشانی ڕادەپەڕێنێت

كَيْفَ يُؤَدِّي الْمُوَظَّفُ الْأَمَانَةَ


نوسینی زانای فەرموودەناس
عبد المحسن بن حمد العباد البدر

وەرگێڕانی
عثمان أحمد



چاپی دووەم رجب١٤٤١

# فەرمانبەر

## چۆن ئەركی سەرشانی ڕادەپەڕێنێت

## كَيْف يُؤَدِّي الْمُوَظَّف الْأَمَانَة


نوسینی زانای فەرموودەناس

عبد المحسن بن حمد العباد البدر

وەرگێڕانی

عثمان أحمد



چاپی دووەم

رجب ١٤٤١

# فەرمانبەر چۆن ئەركی سەرشانی ڕادەپەڕێنێت

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری هەموو دروستكراوەكان ، وە درود وسلاوی كامڵ وتەواو لەسەر سەرداری پێغەمبەران وپێشەوای لە خودا ترسان ، پێغەمبەرمان محمد ﷺ وكەسوكار وهاوەڵانی وئەوانەی شوێنیان كەوتوون تا ڕۆژی دوایی .

ئەم نووسراوە نامیلكەیەكی بچووكە نوسیومە ئامۆژگاری فەرمانبەران وكرێكاران دەكات بە ڕاپەڕاندنی ئەو ئەركانەی كە پێیان سپێردراوە ، بە هیوای ئەوەی سوودمەندبێت ویارمەتی دەریان بێت بۆ پاككردنەوەی نییەتەكانیان وبەباش ڕاپەڕاندنی كارەكانیان وهەستان بەو ئەركانەی كە لە ئەستۆیانە ، داواكارم لە خودا یارمەتیدەر وسەرخەری هەمووان بێت .

# چەند ئایەتێکی پیرۆز لەسەر پێویستی بەجێهێنانی ئەرکی سەرشان

یەك لەو ئایەتە پیرۆزانەی کە باس لە ئەمانەت پارێزی ودوورکەوتنەوە لە خیانەت دەکات ئەو فەرموودەی خودای پەروەردگارە کە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ٥٨ ﴾ [النساء] .

واتە : خودا فەرمانتان پێدەکات کە ئەمانەتەکان بە باشی بدەنە دەستی خاوەنەکانیان ، وە ئیبن کثیر لە ڕاڤەی ئەو ئایەتەدا دەڵێت : خودا هەواڵ دەدات کە فەرمان دەکات بەدانە دەستی ڕاسپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان ، وە لە فەرموودەیەکی حەسەندا لە

سەمرەوە ﵁ دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : ((أدِّ الأمانة إلى مَن ائتمنك ، ولا تَخُن مَن خانك))(١) .

واتە : ئەمانەتی ئەو كەسە بدەوە دەستی كە پێیت دەسپێرێت ، وە خیانەت مەكە لەو كەسەی كە خیانەتت لێدەكات ، ئەو فەرموودەیە هەموو ئەمانەتێك دەگرێتەوە كە پێویستە لەسەر مرۆڤ بەجێی بهێنێت لە مافەكانی خودا بەسەر بەندەكانیەوە لە نوێژ وزەكات وڕۆژو وكەفارەتی نەزر و فەرمانەكانی تر كە لە خەڵك شاراوەیە ، وە هەروەها مافەكانی بەندەكان لەسەر یەكتر ، وەك ئەمانەت وهەموو ئەو شتانەی كە پێیان دەسپێردرێت ، خودای پەروەردگار فەرمانی بە بەجێگەیاندنی كردووە ، هەر كەس بەو شێوەیە نەبێت لە دونیا ئەوە لە دواڕۆژدا ئەو مافانەی لێ وەردەگیرێتەوە .

---

(١).رواه الإمام أحمد وأهل السنن .

وە ئەو فەرموودەی خودا : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٧ ﴾[الأنفال] .

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خیانەت لە خودا وپێغەمبەر ﷺ مەکەن بەوەی فەرمانەکانی بشکێنن وسوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ پشتگوێ بخەن ، وە خیانەت مەکەن لە سپاردەکان لە کاتێکدا کە ئێوە لێی بەئاگان ، ئیبن کثیر دەڵێت : خیانەت هەموو تاوانە بچووك وگەورەکان دەگرێتەوە وە هەموو کردارە تێنەپەڕ و تێپەڕەکانیش[٢] دەگرێتەوە ، وە علی کوڕی ئەبوطلحە دەڵێت : ئیبن عباس رضي الله عنهما دەڵێت :﴿ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ ﴾ ، ئەمانەت ئەو کردەوانەیە کە خودا بەندەکانی پێ

(٢) . واتە : ئەو کردەوانەی کە لە نێوان خودا وبەندەکانە وئەوانەش کە لە نێوان بەندەکان خۆیانە والله أعلم (وەرگێڕ) .

ڕاسپاردووە ، واتە فەرزەکان ، وە دەڵێت : ﴿لَا تَخُونُوٓاْ﴾ پەیمان شکێنی مەکەن ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا ﴿لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ دەڵێت: بە وازهێنان لە سوننەتەکەی وئەنجامدانی قەدەغەکراوەکانی .

وە ئەو فەرموودەی خودا : ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢ ﴾ [الأحزاب] .

واتە: ئێمە ئەمانەتمان کە هەموو فەرمانەکانی ئایینەکانە دایە سەر ئاسمانەکان وزەوی وشاخەکاندا ، هەڵیان نەگرت ولێی ترسان ، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت بەڕاستی ستەمکار ونەفامە ، ئیبن کثیر رَحِمَهُ ٱللَّهُ دوای ئەوەی چەند لێکدانەوەیەکی بۆ وشەی (الأمانة) هێناوە : وەك گوێڕایەڵی وفەرزەکان وئاین وسنوورەکانی خودا ، دەڵێت : هەموو ئەوانە هیچ ناکۆکیەك نییە لە نێوانیاندا ، بەڵکو کۆك وتەبان وهەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەمانەت پارێز تەکلیفە

وقەبوڵكردنی فەرمانەكان ودووركەوتنەوەیە لە یاساغكراوەكان ئەگەر بەباشی پێی هەستا پاداشت دەدرێتەوە وئەگەر كەمتەرخەمی كرد سزا دەدرێت ، مرۆڤ ئەوەی قەبوڵكرد هەرچەندە لاواز ونەفام وستەمكارە ئەوانەیان نەبێت كە خودا یارمەتیداون ، پەنا بەخودا .

وە ئەو فەرموودەی خودا : ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ٨ ﴾ [المؤمنون] .

ئیبن كثیر دەڵێت : ئەگەر ئەمانەتیان درایە دەست خیانەت ناكەن وئەگەر بەڵێنیاندا ناپاكی ناكەن ، ئەوەش سیفەتی باوەڕدارانە ، وە دژی ئەمانەش سیفەتی دووڕووەكانە ، وەك لەم فەرموودە صەحیحەدا هاتووە : ((آية المنافق ثلاث: إذا حدَّث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا ائتُمن خان)) ، وفي روايە : ((إذا حدَّث كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر)) .

واتە : نیشانەی دووڕوو سێ شتە : كاتێك قسەیكرد درۆ دەكات ، وە كاتێك بەڵێنیدا پەیمان شكێنی دەكات ، وە ئەگەر

ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێدەكات ، وە لە ڕیوایەتێكی تردا كاتێك قسەیكرد درۆ دەكات ، وە كاتێك بەڵێنیدا پەیمان شكێنی دەكات ، وە كاتێك بەشەڕبێت جنێوو قسەی ناشیرین دەكات .

# فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێویستی بەجێهێنانی ئەرکی سەرشان

ئەمانە کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەری خودان ﷺ لەسەر پاریزگاری لە ئەمانەت ووریاییدان لە پشتگوێ خستن ولەدەستدانی :

١. لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه دەڵێت : ((بينما النَّبيُّ ﷺ في مجلس يُحدِّث القوم ، جاءه أعرابيٌّ فقال: متى الساعة؟ فمضى رسول الله ﷺ يُحدِّث ، فقال بعضُ القوم : سمع ما قال فكره ما قال ، وقال بعضُهم : بل لم يسمع ، حتى إذا قضى حديثه قال : أين أراه السائل عن الساعة ؟ قال : ها أنا يا رسول الله ، قال : فإذا ضُيِّعت الأمانة

فانتظر الساعة ، قال : كيف إضاعتُها ؟ قال: إذا وُسِّد الأمرُ إلى غير أهله فانتظر الساعة))[٣] .

واته : كاتێك پێغەمبەر ﷺ لە كۆڕێكیدا وتاری بۆ خەڵك دەدا ، دەشتەكیەك هات بۆلای پێی وت : كەی قیامەتە ، پێغەمبەر ﷺ لای لێنەكردەوە وبەردەوام بوو لەسەر وتاردان ، هەندێك لە خەڵكەكە وتیان ئەوەی كەوتی بیستی بەڵام پێی ناخۆش بوو ، وە هەندێكی تریان وتیان : بەڵكو نەی بیست ، كاتێك لە وتارەكەی بوویەوە فەرمووی : لە كوێیە ئەو كەسەی پرسیاری قیامەتی كرد ؟ وتی : ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خودا ، فەرمووی : ئەگەر ئەمانەت ونكرا چاوەڕوانی قیامەت بە ، وتی : ئەی زایەكردن وونكردنی چۆنە ؟ فەرمووی : ئەگەر ئیشوكار سپێردرا بەكەسانی نەشیاو چاوەڕوانی قیامەت بكە .

---

(٣). رواه البخاري (٥٩) .

٢. لـه ئەبوهريرەوە رضي الله عنه دەڵێت : قال رسول الله ﷺ : «أدِّ الأمانة إلى مَن ائتمنك، ولا تَخُن من خانك»(٤) .

واته : ئەمانەتی ئەو کەسە بدەوە دەستی کە پێت دەسپێرێت ، وە خیانەت مەکە لەو کەسەی کە خیانەتت لێدەکات .

٣. لـه ئەنەسەوە رضي الله عنه دەڵێت: قال رسول الله ﷺ : «أوَّل ما تفقدون من دينكم الأمانة، وآخره الصلاة»(٥)

واته : یەکەم کارێك کە لـە ئاینەکەتان لـە دەستی دەدەن ئەمانەتە ، وە کۆتا کاریش نوێژە .

٤. لـه ئەبوهريرەوە رضي الله عنه : عن النَّبيِّ ﷺ قال : «آية المنافق ثلاث: إذا حدَّث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا ائتُمن خان»(٦).

---

(٤).رواه أبو داود (٣٥٣٥) والترمذي (١٢٦٤)، وقال : «هذا حديث حسن غريب»، وانظر: السلسلة الصحيحة للألباني (٤٢٤).

(٥).رواه الخرائطي في مكارم الأخلاق (ص ٢٨)، وانظر: السلسلة الصحيحة للألباني (١٧٣٩).

(٦)رواه البخاري (٣٣) ومسلم (١٠٧) .

واتە : نیشانەی دووڕوو سێ شتە : كاتێك قسەیكرد درۆ دەكات ، وە كاتێك بەڵێنیدا پەیمان شكێنی دەكات ، وە ئەگەر ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێدەكات .

# گەر فەرمانبەر ئەركی سەرشانی بەباشی ڕاپەڕێنێت لە دونیا و دوارِۆژیش پاداشت دەدرێتەوە

گەر فەرمانبەر ئەركی سەرشانی بەباشی ڕاپەڕاند بە هیوای پاداشتی خودا ئەوە ئەستۆ پاك دەبێت و شایەنی پاداشتە لـەسەر كردەوەكانی لـە دونیا ، وە پاداشتی ڕۆژی دوایش بە دەست دەهێنێت ، وە ئەو بەڵگە شەرعیانەی كە هاتوون كە بەڵگەن لـەسەر پاداشتی مرۆڤ لـەسەر كردەوەكانی ، پێویستە مەبەستی خودا بێت لـە ئەنجامدانی ، وە پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ [النساء] .

واتە : خێر و چاكە لە زۆربەی ئەو گفتوگۆ نهێنیانەدا نییە ، ئەوانەیان نەبێت كە فەرمان بە بەخشین و كاری چاكە و چاكسازی نێوان خەڵك دەكەن ، ئەوكەسەی لەبەر ڕەزامەندی خودا ئەو كارانە ئەنجام بدات پاداشتی گەورەی دەداتەوە ، وە بوخاری ومسلم لە ئەبومسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان كردووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەفەرموێت: «إذا أنفق الرجلُ على أهله يحتسبُها فهو له صدقة» .

واتە : ئەگەر پیاو خەرجی ماڵ ومنداڵی بكات نیەتی بۆ خودا بێت ئەوە دەبێتە چاكە بۆی ، وەدیسان دەفەرموێت : «ولستَ تُنفق نفقةً تبتغي بها وجه الله ، إلاَّ أُجرتَ بها ، حتى اللقمة تجعلُها في فِي امرأتِك»(٧) .

---

(٧).رواه البخاري (٥٣٥٤) ومسلم (١٦٢٨) .

واته : هیچ بەخشینێك نابەخشیت كە نیەتت بۆ خودا بێت ئیلا لەسەری پاداشت دەدرێیتەوە هەتا ئەو پاروەی دەیكەیتە دەمی خێزانەكەتەوە ، ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە ئەگەر موسڵمان ئەوەی پێویستە لەسەری بەرامبەر خەڵك ڕایپەڕاند ئەستۆی پاك دەبێت وپاداشت وچاكەی دەست دەكەوێت ئەگەر نییەتی خودا بوو .

# پاراستنی کاتی دیاری کراوی ئیش بۆ خزمەتی ئیشەکە

پێویستە لەسەر هەموو فەرمانبەر و کرێکارێك کاتی تایبەت بەدەوامی لە ڕایکردنی ئەو کارەدا بەکارببات کە بۆی تایبەت کراوە ، وە نابێت سەرقاڵی ئیشوکاری تر بێت جگە لەو کارەی کە پێویستە لەو کاتەدا ڕایپەڕێنێت ، کاتی دەوام یان هەندێك لە کاتی دەوام نابێت لە بەرژەوەندی تایبەتدا بەکاربهێنێت ، وە هەروەها بەرژەوەندی کەسانی تریش مەگەر ئەوەی پەیوەندی بە وەزیفەکەیەوە هەبێت ، چونکە کاتی دەوام موڵك ومافی فەرمانبەر وکرێکار نییە ، بەڵکو لە بەرژەوەندی ئەو کارە دەبێت بەسەر ببرێت کە لە بەرامبەریدا مووچە وەردەگرێت ، شێخ معمر کوڕی علی بغدادی (٥٠٧ك) ئامۆژگارییەکی پڕ سوود وڕەوانی (الملك الوزیر)ی دەسەڵاتدار کردووە ، لەسەرەتاکەیدا پێی دەڵێت :

((زانراوه ـ كاربەدەستی ئیسلام!ـ تاكەكانی كۆمەڵگە سەرپشكن لە ویست وئیش وكاریان ، گەر ویستیان ئەنجامی دەدەن ، وە گەر نەشیان ویست پشتگوێی دەخەن ، بەڵام ئەو كەسەی بەرپرسیاریەتیەكی گرتە ئەستۆ سەرپشك نییە لە ویست وئیشوكاری چونكە ئەوەی فەرمانڕەوایە لە ڕاستیدا كرێكارە ، كە كاتەكەی خۆی فرۆشتووە وبەهاكەشی وەرگرتووە ، بەوەش هیچ لە كاتی نەماوە كە بەویستی خۆی هەڵسوكەوتی تێدا بكات ، وە بۆی نییە نوێژی سوننەت وئیعتكاف بكات ، ...چونكە ئەوانە سوننەتن بەڵام ئەمەیان فەرز وپێویستە )) وە هەر لە وتەكانی كاتێك ئامۆژگاری دەكرد : (گۆڕەكەت ئاوەدان بكەرەوە وەك چۆن كۆشكەكەت ئاوەدانكردووەتەوە) .

وەك چۆن مرۆڤ حەزدەكات مووچەكەی بە تەواوی وەربگرێت وهیچی لێكەم نەكرێت ، بەو شێوەیە پێویستە لەسەری ئەو كاتەی كە بۆ دەوامەكەی تایبەتكراوە بەكار بهێنێت بۆ بەرژەوەندی

ئیشەكەی ، خودا بەخراپ باسی ئەوكەسانە دەكات كە مافەكانی خۆیان لە كێشانە وپێوانە بە تەواوی وەردەگرن ولە مافەكانی ئەوانی تردا كورتبڕی تێدا دەكەن وبەباشی بەجێیناهێنن وەك دەفەرموێت : ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾[المطففين] .

واتە: وەیل كە شیوێكە لە دۆزەخ بۆ ئەو كەسانەی ئەگەر شتێك لە خەڵك بكڕن بەباشی بۆ خۆیان كێشانە و پێوانەی دەكەن ، بەڵام ئەگەر بە خەڵكی بفرۆشنەوە بە تەواوی مافیان نادەن ، ئایە ئەو كەسانە زیندوو ناكرێنەوە بۆ ڕۆژێكی مەزن ، ئەو ڕۆژەی خەڵك لە حوزوری خودای پەروەردگاردا ڕادەوەستن .

# هۆكارەكانی هەڵبژاردنی كرێكار و فەرمانبەر

بنەمای هەڵبژاردنی هەموو فەرمانبەر وكرێكارێك پێویستە توانا وئەمانەت پارێزی بێت ، چونكە بە توانای دەتوانێت بەو ئەركانە هەستێت كە پێی ڕاسپێردراوە ، وە بە ئەمانەت پارێزیش بەو شێوەیە ڕایدەپەڕێنێت كە ئەستۆی پاك  وبێبەری بێت ، چونكە بە ئەمانەت پارێزی شتەكان لە شوێنی خۆیدا دادەنرێت ، وە بە توانای ولێهاتووی سەركەوتوو دەبێت لە ئەنجامدانی ئەوەی لەسەری پێویستە ، وە خودا باسی یەكێك لە كچەكانی پێغەمبەرەكەی (مدین) دەكات كە بە باوكی وتووە كاتێك موسا ﵇ ئاوی مەڕومالاَتەكەی بۆدان : ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦ ﴾ [القصص] .

واتە : باوكە پاداشتی بدەرەوە چونكە بەڕاستی باشترین كەسێك كە شایانی پاداشت بێت كە سێكی بە توانا وئەمانەت پارێزە ، وە عفریت كە لە جنۆكەیە كاتێك ئامادەی خۆی دەربڕی بۆ

سولـەیمان پێغەمبەر ﷺ بۆ هێنانی كورسیەكەی بەڵقیس دەڵێت :
﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ ٣٩ ﴾[النمل].

واتە : من بۆتی دەهێنم پێش ئەوەی لـە شوێنی خۆت هەستیت لـەوەدا بەتوانا و ئەمانەت پارێزم ، واتە توانای هەڵگرتن و هێنانیم هەیە و پارێزگاری لـەوەی تێیدایە دەكەم ، وە خودا هەواڵ لـەبارەی یوسفەوە دەدات كە بە پادشاكەی فەرمووە : ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ ﴾ [یوسف] .

واتە : كۆگاكانی سەرزەمینی دەسەڵاتەكەتم پێ بسپێرە چونكە دەیپارێزم ولـەوەشدا زانام .

وە پێچەوانە و دژی توانای و ئەمانەت پارێزی نەتوانكاری و خیانەتە ، ئەوەش بنەوای دانەمەزراندنە لـەسەر ئیش و كار ودەبنە هۆی لـەسەركار لابردن ، وە كاتێك عومەری كوڕی خەتاب ﷺ سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصی ﷺ كردە كاربەدەستی كوفە ، وە هەندێك لـە خەڵكی نەفامی كوفە قسەیان لـەسەر سەعد

كرد و سەرزەنشتیان كرد لای عومەری كوڕی خەتاب ، عومەر بەرژەوەندی لەوەدابینی كە لەسەر كار لاییبات لەبەر ڕێگە گرتن لە كوكە و ئاشوب، بۆ ئەوەی كەسێك لەو نەفامانە دەستدرێژی نەكەنەسەر سەعد ، كەچی عومەر لەسەرە مەرگدا شەش كەسی دیاریكرد لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ كە لەدوای خۆی ببێتە خەلیفە ، سەعدی كوڕی ابی وەقاص یەكێك لەوانە بوو ، ترسا وا گومان ببرێت كە لەسەر كارلابردنی سەعد لە كاربەدەستی لە كوفە لەبەر نەشیاوی بووە ، ئەو گومانەی بەو وتەی ڕەوانەوە كە فەرمووی: «فإن أصابت الإمرة سعداً فهو ذاك ، وإلاَّ فليستعن به أيكم ما أُمِّر ؛ فإِنِّي لَمَ أعزله عن عجز ولا خيانة»(٨) .

---

(٨)رواه البخاري (٣٧٠٠) .

واتە : ئەگەر سەعد بوو بە خەلیفە باشە ، گەر کەسێکی ترتان بوو بە خەلیفە پشتی پێببەستن بۆ بەرپرسیارێتی چونکە من لەبەر نەتوانکاری و خیانەت لەسەر کارم لانەبرد .

وە لە صحیحی موسلمدا لە ئەبو زەرەوە رضي الله عنه دەڵێت : (( قلت: يا رسول الله! ألاَ تستعمِلُني؟ قال : فضرب بيده على منكبي ، ثم قال : يا أبا ذر إنَّك ضعيف ، وإنَّها أمانة ، وإنَّها يوم القيامة خزي وندامة ، إلاَّ مَن أخذها بحقِّها وأدَّى الذي عليه فيها)) ، وفيه أيضاً (١٨٢٦) عن أبي ذر رضي الله عنه أنَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : ((يا أبا ذر إنِّي أراك ضعيفاً، وإنِّي أحبُّ لك ما أحبُّ لنفسي، لا تأمَرنَّ على اثنين، ولا تَوَلَيَنَّ مال يتيم)) .

واتە : وتم ئەی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بەرپرسیارێتیم پیێ بسپێرە ، دەڵێت : بەدەستی لەسەر شانی دام ، دواتر فەرمووی : ئەی ئەبو زەر تۆ لاوازیت ئەوەش ئەمانەتە ، وە ڕۆژی دوایی سەرشۆڕی و پەشیمانییە ، ئەو کەسە نەبێت مافی دەدات و ئەوەی لەسەریەتی ڕایدەپەڕێنێت ، وە دیسان لە ئەبوزەرەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی

فەرمووە : ئەی ئەبوزەر من لاواز دەتبینم ، وە من ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە ، مەبە بەرپرسیاری دوو کەس ، وە ماڵی هەتیویش مەگرە ئەستۆ .

# گەورە بەرپرسان سەرمەشقن لە بەهێزی ولاوازی بۆ فەرمانبەرەكانی تر

ئەگەر گەورە بەرپرسان بە باشی وبە شێوازێكی جوان بە كارەكانیان هەستان فەرمانبەرەكانیان چاویان لێدەكەن ، هەموو سەركارێك پرسیاری خۆی وئەوانەشی بەرپرسیانە لێدەكرێت ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: «كلُّكم راع ومسؤول عن رعيَّته، فالأمير الذي على الناس فهو راع عليهم وهو مسؤول عنهم، والرجلُ راع على أهل بيته وهو مسؤول عنهم، والمرأة راعية على بيت بعلها وولده وهي مسؤولة عنهم، والعبدُ راع على مال سيِّده وهو مسؤول عنه، ألاَ فكلُّكم راع وكلُّكم مسؤول عن رعيته»(٩) .

---

(٩).رواه البخاري (٢٥٥٤) ومسلم (١٨٢٩) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما .

واته : هەمووتان بەرپرسن ولێپرسراون لەوانەی لە ژێردەستاندان ، کاربەدەستی خەڵك بەرپرسەلێیان وپرسیاری لێدەکرێت لەبارەیانەوە ، وە پیاو بەرپرسە لە خێزانەکەی وپرسیاری لێدەکرێت لەبارەیەوە ، وە ژن بەرپرسە لە ماڵی پیاوەکەی ومنداڵەکانی وپرسیاری لێدەکرێت لەبارەیانەوە ، وە بەندە بەرپرسە لەماڵی خاوەنەکەی وپرسیاری لێدەکرێت لەبارەیەوە ، بەو شێوەیە هەمووتان بەرپرسن و پرسیارتان لەبارەی کارەکانتانەوە لێدەکرێت ، ئەگەر بەرپرسە گەورەکان ئیش و کارەکانیان بە باشی لە هەموو کاتێکدا ڕاپەڕێنن دەبنە سەرمەشق و ڕابەری باش بۆ خوارەوەی خۆیان .

شاعیرێك دەڵێت :

وإنَّك إذ مَا تَأتِ ما أنتَ آمِرٌ        به تُلْفِ مَن إيَّاه تأمُرُ آتِيَا

واته: ئەگەر داوات لە کەسێکی خوارەوەی خۆتکرد کە بە ئەرکەکانی سەرشانی هەستێت ، وە خۆت پێشڕەو بوویت لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانت ، ئەوا ئەوانەی فەرمانیان پێدەکەیت گوێڕایەڵت دەبن وئەوەی فەرمانت پێکردووە ڕایدەپەڕێنن.

# هەڵسوكەوتی فەرمانبەر لەگەڵ خەڵك

## بەو شێوەی كە پێی خۆشە خۆی هەڵسوكەوتی لەگەڵدا بكرێت

ئامۆژگاری لە ئیسلامدا كارێكی گەورەیە ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : «الدِّين النصيحة، قالوا: لِمَن يا رسول الله؟ قال: لله، ولكتابه، ولرسوله، ولأئمة المسلمين وعامتهم»[١٠] .

واتە : ئاین ئامۆژگارییە ، وتیان بۆ كێ ئەی پێغەمبەری خودا ؟ فەرمووی ، بۆ خودا وقورئانەكەی وپێغەمبەرەكەی وكاربەدەستانی موسڵمانان وتێكڕای خەڵك ، وقال جرير بن عبد الله البجلي رضي الله عنه : ((بايعتُ رسول الله ﷺ على إقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، والنصح لكلِّ مسلم))[١١] .

---

(١٠).رواه مسلم (٥٥) عن أبي رقية تميم بن أوس الداري رضي الله عنه .

(١١).رواه البخاري (٥٧) ومسلم (٥٦).

واتە : دەڵێت پەیمانم دا بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر نوێژکردن و زەکاتدان و ئامۆژگاری بۆ هەموو موسڵمانێك.

وەك چۆن هەر فەرمانبەرێك یان کرێکارێك ئەگەر ئیشێکی هەبوو لای کەسانێکی تر پێویستە بە شێوەیەکی جوان هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن ، بەو شێوەیە پێویستە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بکات ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت : «فمَن أحبَّ أن يُزحزح عن النار ويدخل الجنَّة فلتأته منيَّتُه وهو يؤمن بالله واليوم الآخر، وليأت إلى الناس الذي يحبُّ أن يُؤتى إليه»[١٢] .

واتە : ئەوەی پێی خۆشە لە ئاگر پارێزراو بێت وبچێتە بەهەشتەوە کاتێك لەگەڵ مردن ڕووبەڕوو دەبێتەوە با باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێت ، وە بەرامبەر خەڵك بەو شێوەیە بێت کە پێی خۆشە خەڵك وابن لەگەڵی .

---

(١٢) . رواه مسلم (١٨٤٤) في حديث طويل عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما .

واتە : بەو شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ خەڵكدا بكە كە حەز دەكەیت ڕەفتارت لەگەڵدا بكەن ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : «لا يؤمن أحدُكم حتى يُحبَّ لأخيه ما يحبُّ لنفسه»(١٣) .

واتە : باوەڕداری تەواو نییە هەركەسێك لە ئێوە تا بۆ براكەی پێی خۆش بێت ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە وە خودا سەرزەنشتی ئەو كەسە دەكات كە بە پێچەوانەی ئەو شێوازە ڕەفتار دەكات كە بۆ خۆی پێی خۆشە خەڵك ڕەفتاری لەگەڵدا بكەن وەك دەفەرموێت : ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ ﴾[المطففين]

، وە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( إنَّ الله عزَّ وجلَّ حرَّم

---

(١٣)رواه البخاري (١٣) ومسلم (٤٥) عن أنس رضي الله عنه .

عليكم عقوق الأمهات ، ووأد البنات ، ومنعاً وهات ، وكره لكم ثلاثاً: قيل وقال ، وكثرة السؤال ، وإضاعة المال))(١٤) .

واته : خودای بەرز وبالآدەست حەرامی کردووە لەسەرتان پێشێلکردنی مافەکانی دایك وباوك ، وزیندەبەچاڵکردنی کچان وە چروکی وخۆگرتنەوە وداواکردن ، وە سێ شتی مەکروە کردووە قسەوقسەلۆك گێڕانەوە ، وزۆر پرسیارکردن وپارە وماڵ بەفیڕۆدان ، ئەم فەرموودەیە بەخراپ باسی ئەو کەسانە دەکات کە ماڵ کۆکەرەوە وچروکن وە هەر وەردەگرن ونابەخشن ، خودا بیری کەسوکاری هەتیو دەخاتەوە کە بترسن لە منداڵەکانیان لە دوای خۆیان ، وەك دەفەرموێت : ﴿ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَـٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ۝٩ ﴾ [النساء] .

---

(١٤)أخرجه البخاري (٢٤٠٨) ومسلم (٥٩٣) عن المغيرة بن شعبة رضي الله عنه .

واتە : وەك چۆن پێیان خۆشە لەگەڵ منداڵەكانیان كە لاواز وبێ پشت وپەنان چاكە بكرێت دوای مردنیان ، بەو شێوەیە پێویستە لەسەریان چاكەكاربن لەگەڵ ئەو هەتیوانەی كە لە ژێر دەستیاندان ولێیان بەرپرسن .

# فەرمانبەر دەبێت ئەوەی لەپێشدا هاتووە ئیشو کاری بەڕێبکات

لـە داد وویژدانە کە فەرمانبەر کەسێك دوا نەخات کە پێش کەسانی تر هاتبێت ، وە کەسێك دواتر هاتبێت پێشی نەخات ، بەڵکو ڕایی کردنی کارەکان دەبێت لـە پێشدا بۆ ئەوانە بێت کە سەرەتا هاتوون ، وە لـە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بەڵگەمان لـەسەر ئەوە هەیە لـە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه دەڵێت : « بينما النَّبيُّ ﷺ في مجلس يُحدِّث القوم، جاءه أعرابيٌّ فقال: متى الساعة ؟ فمضى رسول الله ﷺ يُحدِّث ، فقال بعضُ القوم : سمع ما قال فكره ما قال ، وقال بعضُهم: بل لَم يسمع، حتى إذا قضى حديثه قال: أين أراه السائل عن الساعة ؟ قال : ها أنا يا رسول الله ، قال : فإذا ضُيِّعت الأمانة

**فانتظر الساعة ، قال : كيف إضاعتُها ؟ قال : إذا وُسِّد الأمرُ إلى غير أهله فانتظر الساعة»**(١٥)

ئەم فەرموودەیە لەو ڕوانگەیەوە دەبێتە بەڵگە كە پێغەمبەری خودا ﷺ وەڵامی ئەو كەسەی نەدایەوە كە پرسیاری ڕۆژی دوایی كرد هەتا لە وتاری ئەوانی پێشووتر نەبوویەوە ، ئیبن حجر لە ڕاڤەی دا دەڵێت : وانەی ئەوەی لێوەردەگیرێت كە ئەوەی پێشتر بێت شایانترە بۆ ڕاپەڕاندنی كارەكانی ، هەروەها فەتوا وحوكمدان وهەموو كارەكانی هاوشێوەیان .

وە لە ژیاننامەی ئەبو جعفری كوڕی جریر الطبری لە (لسان المیزان)ی حافز ابن حجر دا هاتووە دەڵێت : ئیبن عساكر لە ڕێگەی ئەبو معبد عثمانی كوڕی ئەحمد الدینوری وە دەڵێت : ئامادەی كۆڕێكی محمدی كوڕی جریر بووم كە فضلی كوڕی

---

(١٥).رواه البخاري (٥٩).

جعفر کوڕی الفراتی وەزیریش لەوێ ئامادەبوو ، بەڵام پێش ئەو پیاوێکی لابوو ، الطبری بە پیاوەکەی وت بۆ ناخوێنیت ؟ ئەویش ئاماژەی بۆ وەزیر کرد ، الطبری پێی ووت : ئەگەر گەڕ و نۆبەتی تۆ بوو گرنگە نەبە دیجلە بدە وە نە بە فورات ، دەڵێم ئەمە لە شتەخۆش وڕەوان بێژیەکانیەتی ولانەکردنەوەیەتی بۆ کەسانی پلە وپایە بەرز لە دونیا .

# فەرمانبەر دەبێت دەستپاك بێت ودووربێت لە بەرتیل و دیاری وەرگرتن

پێویستە لەسەر هەموو فەرمانبەرێك كە دەست پاك ونەفس بەرز بێت ودڵی دەوڵەمەند بێت ودووربێت لە خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا ، بەهۆی بەرتیلەوە كە پێی دەدرێت ئەگەرچی بەناوی دیاریشەوە بێت ، ئەگەر ماڵی خەڵكی بە ناڕەوا برد ئەوە بە ناڕەوا خواردوویەتی ، وە خواردنی ماڵی خەڵك بەناڕەوا یەكێكە لە هۆكارەكانی قەبوڵ نەبوونی نزاو پاڕانەوە ، ئیمامی مسلم لە صحیحەكەیدا لە ئەبوهریرەوە ﵁ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( أيُّها الناس! إنَّ الله طيبٌ لا يقبل إلاَّ طيباً، وإنَّ الله أمر المؤمنين بما أمر به المرسَلين ، فقال : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٥١﴾ [المؤمنون] ، وقال : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ١٧٢﴾ [البقرة] ، ثم ذكَرَ الرجلَ يُطيل السفر أشعث أغبر، يَمدُّ يديه إلى

السماء: يا ربِّ! يا ربِّ! ومطعمُه حرام، ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغذي بالحرام، فأنَّى يُستجاب لذلك؟!)).

واته : خودا پاكه و پاك نەبێت قەبوڵی ناكات ، وە خودا فەرمانی بە باوەڕداران كردووە وەك چۆن فەرمانی بە پێغەمبەران كردووە ، دەفەرموێت : ئەی پێغەمبەران لـە شتە پاكەكان بخۆن وكردەوەی چاك ئەنجام بدەن بەڕاستی من زانام بەوەی ئەنجامی دەدەن ، وە دەفەرموێت : ئەی باوەڕداران لـەو شتە پاكانە بخۆن كە ڕۆزیم داون ، دواتر باسی پیاوێك دەكات كە لـە سەفەردا زۆر ماوەتەوە و قژی برسكا ودەم وچاو خۆڵاویە ودەستەكانی بۆ ئاسمان بەرز دەكاتەوە ، پەروەردگارا ! پەروەردگارا ! ئەو كەسە خواردنی حەرامە و خواردنەوەی حەرامە و جلوبەرگی حەرامە وە بەحرام گۆشكراوە ، چۆن وەڵامی كەسێكی بەو شێوەیە دەدرێتەوە .

وە لـە صحیحی بوخاریدا زۆر بە توندی سەرزەنشتی خواردنیماڵی حەرام كراوە لـە جندبی كوڕی عبداللـەوە ﷺ دەڵێت :

(( إنَّ أوَّل ما ينتن من الإنسان بطنه ، فمَن استطاع أن لا يأكل إلاَّ

طيباً فليفعل، ومن استطاع أن لا يُحال بينه وبين الجنة بملء كف من دم هراقه فليفعل))[١٦] .

واته : یەكەم شتێك كە مرۆڤی پیێ بۆگەن دەبێت بە هۆی سكیەوەیە ، هەركەس توانی با تەنها شتی پاك بخوات ، وە هەركەس توانی كە پەرژین لـە نێوان خۆی و بەهەشتدا دروست نەكات بە پڕمشتێك خوێنی ڕژاو با وابكات ، وە ئەو فەرمودەی ابو هرەیرە لـە پێغەمبەری خودا ﷺ كە دەفەرموێت : ((ليأتيَنَّ على الناس زمان لا يُبالي المرء بما أخذ المال، أمِنْ حلال أم من حرام))[١٧] .

واته : ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵكدا بێباكن لـەوەی لـە چ سەرچاوەیەكەوە ماڵ و پارە بە دەست دەهێنن ، ئایە حەڵاڵـە یان حەرام ، لای ئەو كەسانە حەڵاڵ ئەوشتەیە كە دەستیان دەكەوێت وە حەرام ئەوەیە كە دەستیان پێناگات ، بەڵام حەڵاڵ لـە ئیسلامدا

---

(١٦).رواه البخاري في صحيحه (٧١٥٢) .

(١٧).رواه البخاري في صحيحه (٢٠٨٣) .

ئەوەیە کە خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەڵاڵیان کردووە ، حەرامیش ئەوەیە خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردووە .

وە لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا ﷺ چەندان فەرموودە هاتووە کە بەڵگەن لەسەر قەدەغەکردنی کرێکاران و فەرمانبەران لە وەرگرتنی پارە ئەگەر ناونرا دیاریش ، لەوانە ئەو فەرموودەی ابو حمیدی الساعدی دەڵێت : (( استعمل رسول الله ﷺ رجلاً من الأسد، يُقال له : ابن اللتبيَّة على الصدقة ، فلمَّا قدم قال : هذا لكم، وهذا لي أُهدي لي، قال: فقام رسول الله ﷺ على المنبر ، فحمد الله وأثنى عليه ، وقال : ما بال عامل أبعثه فيقول: هذا لكم، وهذا أُهدِيَ لي؟! أفلاَ قعدَ في بيت أبيه أو في بيت أمِّه حتى ينظرَ أيُهدَى إليه أم لا؟! والذي نفسُ محمَّد بيده! لا ينال أحدٌ منكم منها شيئاً إلاَّ جاء به يوم القيامة يحمله على عُنُقه، بعير له رُغاء، أو بقرة لها

خوار، أو شاة تيعَر، ثم رفع يديه حتى رأينا عفرتَيْ إبطيه، ثم قال: اللَّهمَّ هل بلَّغت؟ مرَّتين))(١٨) .

واته پێغەمبەری خودا ﷺ پیاوێكی لە عەشیرەتی الأسدی كردە كاربەدەست لە ماڵی خێر ناوی ئیبن اللتبیه بوو ، كاتێك هاتەوە وتی ئەوە بۆ ئێوەیە ، ئەمەش بە دیاری بۆمن هێنراوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ هەستایە سەر مینبەر ، سوپاس وستایشی خودای كرد وفەرمووی : ئەوە چییە كرێكارێك بە كارێك ڕادەسپێرم دەڵێت : ئەوە بۆ ئێوەیە و ئەوەش بەمن بەدیاری بەخشراوە ؟! ئایە لە ماڵی باوكی یان ماڵی دایكی دابنیشێت باسەیر بكات دیاری پێدەدەن یان نا ؟! سوێند بەو كەسەی نەفسی محمدی بەدەستە ! هەركەس لە ئێوە شتێك لەوانە ببات لە ڕۆژی دوایدا دێت لەسەر گەردنی حوشترێكی هەڵگرتووە و دەنگی دێت

(١٨).رواه البخاري (٧١٧٤) ومسلم (١٨٣٢) وهذا لفظه .

يان مانگايەكى هەڵگرتووە دەنگى لێوەدێت يان مەڕێكى هەڵگرتووە كە دەنگى لێوە دێت ، دوايى دەستى بەرز كردەوەهەتا سپێتى هەردوو ژێر باڵيمان بينى ، وە فەرمووى :پەروەردگار من گەياندم ؟ دوو جار ، وە لە ئەبوهريرەوە ﵁ دەڵێت : ((قام فينا رسول الله ﷺ ذات يوم ، فذكر الغلولَ فعظَّمه وعظَّم أمرَه، ثم قال: لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته بعير له رغاء، يقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك، لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته فرسٌ له حَمحمة، فيقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك، لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته شاة لها ثغاء، يقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك، لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته نفس لها صياح، فيقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك، لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته رقاع تخفق، فيقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا

أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك، لا ألفينَّ أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته صامت، فيقول: يا رسول الله! أغِثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً؛ قد أبلغتك))[١٩].

واته : ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا ووتاری بۆ خوێندین ، باسی دزینی كرد لە دەستكەوتی جەنگ وزۆر بەگەورە وگرنگ باسی كرد ، دواتر فەرمووی : نەبینم كەسێك لە ئێوە لە ڕۆژی دواییدا بێت وحوشترێك لەسەر شانی بێت و دەنگی لێوە بێت ، بڵێت ئەی پێغەمبەری خودا فریام كەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناكرێت بۆت ، ئاگادارم كردیتەوە ، وە نەبینم كەسێك لە ئێوە لە ڕۆژی دواییدا بێت وئەسپێك لەسەر شانی بێت ودەنگی لێوە بێت ، بڵێت ئەی پێغەمبەری خودا فریام كەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناكرێت بۆت ، ئاگادارم كردیتەوە ، وە نەبینم كەسێك لە

(١٩). رواه البخاري (٣٠٧٣) ومسلم (١٨٣١). واللفظ له. .

ئێوە لـە ڕۆژی دواییدا بێت ومەڕێك لـەسەر شانی بێت و دەنگی لـێوە بێت ، بلـێت ئەی پێغەمبەری خودا فریامکەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناکرێت بۆت ، ئاگادارم کردیتەوە ، وە نەبینم کەسێك لـە ئێوە لـە ڕۆژی دواییدا بێت و نەفسێك لـەسەر شانی بێت و دەنگی لـێوە بێت و هاوار بکات ، بلـێت ئەی پێغەمبەری خودا فریام کەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناکرێت بۆت ، ئاگادارم کردیتەوە ، نەبینم کەسێك لـە ئێوە لـە ڕۆژی دواییدا بێت و جل وبەرگ لـەسەر شانی بێت و بلـێت ئەی پێغەمبەری خودا فریام کەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناکرێت بۆت ، ئاگادارم کردیتەوە ، نەبینم کەسێك لـە ئێوە لـە ڕۆژی دواییدا بێت و بێدەنگێك واتە ئالـتون و زیو لـەسەر شانی بێت ، بلـێت ئەی پێغەمبەری خودا فریام کەوە ، پێیدەفەرمووم هیچم پێناکرێت بۆت ، ئاگادارم کردیتەوە ، وە ئەو

فەرموودەی ئەبو حمیدی الساعدی ﵁ دەفەرموێت : أنَّ رسول الله ﷺ قال : ((هدايا العمال غلول))[٢٠] .

واته : دیاری كرێكاران وفەرمانبەران وەك دزیه لە دەستكەوتی جەنگ پێش دابەشكردنی،كه هاو واتای باسەكەی ئیبن اللتبیه یه.

وه ئەو فەرمودەی عدی كوڕی عمیره ﵁ دەڵێت : سمعت رسول الله ﷺ يقول : ((من استعملناه منكم على عمل فكَتَمَنا مخيطاً فما فوقه ، كان غلولاً يأتي به يوم القيامة))[٢١] .

واته : بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : گەر كەسێكمان لە ئێوە ڕاسپارد بۆ ڕاپەڕاندنی كارێك دەرزیەك یان هەرشتێكی ترمان لێبشارێتەوە ، ئەوە دزیه لە ڕۆژی دواییدا دەبێت بیهێنێت .

---

(٢٠).رواه أحمد (٢٣٦٠١) وغيره، وانظر تخريجه في إرواء الغليل للألباني (٢٦٢٢)، وهو بمعنى حديثه المتقدّم في قصة ابن اللتبية.

(٢١).أخرجه مسلم (١٨٣٣).

وه لـه ژياننامەى عياضى كوڕى غنم لـه كتێبى "صفةالصفوة"ى ئيبن الجوزى دا هاتووه : كه فەرمانڕەواى عمر رضي الله عنه بوو لـەسەر حمص ، لـه باسێكى درێژدا به هەندێك لـه خزمەكانى دەڵێت : سوێند به خودا ! گەر به هەرِە(مشار) بكرێم به دوو بەشەوه پێم خۆشتره لـەوەى كه فلسێك خيانەت بكەم يان ستەم بكەم .

وه ئيبن القيم دەڵێت : لـه بەڵگەكانى رِێگەگرتن لـه بيانوو (بەشى پازدەيەم : پێويسته كاربەدەست ودادوەر ونێوانكاران قەدەغه بكرێت لـەسەريان ديارى وەربگرن ، كه بنچينەى گەندەڵى جيهانه وه هەروەها كاردانه دەستى كەسانى نەشياو وناپاك وكەسايەتى لاواز ونەتوانكاران ، به هۆى ئەوانەوه هێنده گەندەڵى زۆر بووه كه تەنها خودا دەتوانێت ژمێرى بكات ، هەموو ئەوه به هۆى وەرگرتنى دياريیەوەيه لـەلايەن كەسانێكەوه كه لـه كاتى ئاساييدا دياريیان پێنادرێت بەڵكو بەهۆى رِاپەرِاندنى كارەكەيەوەيه ، وه خۆشويستنت بۆ شتێك نابينا ونابيست دەكات ، بەوەش به

ئارەزووی خۆی كاری ئەو كەسە ڕادەپەڕێنێت وەك پاداشتی دیارییەكەی وە چاو پۆشی لەوە دەكات كە شیاو نییە .

داواكارم لە خودای پەروەردگار كە هەموو فەرمانبەر وكرێكارانی موسڵمانان یارمەتی بدات بۆ ڕاپەڕاندنی ئەركەكانیان بەو شێوەیەی كە خودای بەزر وبالاّ ڕازی دەكات ودەبێتە مایەی پاداشت وچاكە بۆ دونیا ودوارۆژ ، وە درود وسلاّو لەسەر بەندە وپێغەمبەرەكەی محمد ﷺ وئال وهاوەلاّنی .

# ناوەڕۆك